








**حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**وەزارەتی پڵان دانان**

**دەستەی ئاماری هەرێم**

# ئەنجامەکانی پرۆسەی گەمارۆسازی و ژمارەدانان

# 2009

## پارێزگای هەولێر




**راپۆرتی ژمارە 2**

## دامـــــەزراوەکان

## پێشەکی

دوای 5 سال لە دەرچوونی بریاری ئەنجامدانی سەرژمێری لە ساڵی 2004، هەوڵەکان لە سالی 2009 چڕ کران بۆ ئەنجام دانی سەرژمێری گشتی دانیشتوان و ئاڤاهیان لە عێراق بەگشتی و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی.

ئامادەکاریەکانی سەرژمێری لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی گەمارۆسازی و ژمارە دانان لە سەرتاسەری عێراق و بە هەرێمی کوردستانیشەوە گەیشتنە لوتکە. ئەم پرۆسەیەی گەمارۆسازی و ژمارەکردنە یەك قۆناغ لە پێش خودی پرۆسەی سەرژمێری یەوە دێت و گرنگییەکەی لەوەدایە کە چوارچێوەیەکی تەواو لە هەموو بوارەکاندا دەخاتە بەردەست لەوانەش دانیشتوان، شوێنی نیشتەجێبوون، دامەزراوەکان و چالاکییە ئابوورییەکان. دواتر ئەم چوارچێوەیە بەکار دێت نەك تەنها بۆ دابەش کردنیان لەسەر بژمێرەکان تاکو هەر یەکێکیان لە رۆژی سەرژمێریدا چوارچێوەی کارەکانیان بزانن، بەلکو وەك چوارچێوە بۆ هەموو ئەو رووپێوانەش بەکار دێت کە دوای پرۆسەکە ئەنجام دەدرێن لە گشت بوارەکانی کۆمەلایەتی، تەندروستی، ئابووری، خوێندن و هتد.

ئەم کارە لە هەرێمی کوردستان بە هەماهەنگی لەگەل وەزارەتی پەروەردە ئەنجام درا و لەشکرێکی ئامادە لە مامۆستایانی بەرێز راهێنران بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی بەلام بەداخەوە لەبەر دەستێوەردانی سیاسی چەند لایەنێکی دژ بەم پرۆسەیە، نەتەنها سەرژمێرییەکە ئەنجام نەدرا، تەنانەت تاکو ئەمرۆش هیچ دەنگ و باسێك نیە لەسەر کاتی ئەنجامدانی و ئەگەری دەست پێکردنەوەی سەر لە نوێ بۆ ئامادەکارییەکانی پرۆسەی سەرژمێریی گشتی.

سەرەرای هەموو ئەمانە، داتای کۆکراو لەم پرۆسەیەدا - کە لە ناوەراستی ساڵی 2010 پرۆسەی نوێ کردنەوەی بۆ ئەنجامدرا و تەنها تایبەت بوو بە دانیشتوان و یەکەکان و شوێنەکانی نیشتەجێبوون- بەردەوام بەکار دێت بۆ دانانی چوارچێوەی هەموو ئەو رووپێوانەی کە لە هەرێمی کوردستان و لە عێراقیشدا ئەنجام دەدرێن.

لێرەدا پێویستە بەر لە هەموو شتێك رۆڵی بەرپرسانی باڵای حکومەتی هەرێم و هەروەها بەرێز وەزیری پلان دانان زۆر بە بەرزی بنرخێنین کە توانیان بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر هەموو ئەو لێژنە بالایانەی کە لە بەغدا بۆ مەبەستی سەرژمێری پێکهێنرا بوون لێرەش لە هەرێمی کوردستان لەسەر ئاستی هەرێم دووبارەیان بکەنەوە وێرای ئەو هەموو دژایەتییەی کە دەکرا بۆ ئەوەی ئەم کارە سەرنەگرێ و لێژنەکان تەنها لەسەر ئاستی بەغدا بن.

رۆلی بەرێزان پارێزگاری هەر سێ پارێزگاکەی هەرێم و سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان گرنگیی خۆی هەبوو لە سەرپەرشتی کردنی تەواوی پرۆسەکە لە رێگای دروست کردنی لیژنەکانی سەر ئاستی پارێزگا، قەزا و ناحیەکان کە توانییان کارەکان لەسەر ئاستی خۆیان رێك بخەن و ئەو گیرو گرفت و ئاستەنگانەی دەهاتنە پێش چارەسەریان بکەن.

پێویستە پێزانینی خۆمان ئاراستەی سندوقی دانیشتوانی نەتەوەیەکگرتووەکان بکەین کە پالپشتیی تەکنیکییان پێشکەش کرد لە کاتی ئامادەکاریەکان بۆ ئەنجام دانی پرۆسەی گەمارۆسازی و ژمارە دانان.

هەروەها رۆڵی بەڕێوەبەری جێ بە جێ کاری سەرژمێری لە هەرێمی کوردستان کاك محمود عوسمان دیارە کە بە هاوکاری بەڕێوبەرانی ئاماری پارێزگاکان، بەڕێزان حسێن کاکل (ب. ئاماری هەولێر)، چیاڤان عبدالرزاق (ب. ئاماری دهۆك) و علی سالح (ب. ئاماری گەرمیان) بەسەرکەوتوویی سەرپەرشتیی مەیدانیی پرۆسەکەیان ئەنجامدا.

جێی خۆیەتی رۆڵی جوامێرانەی یەکە یەکەی کارمەندانی دەستەی ئامار لە دیوانی دەستە و لە هەموو پارێزگاکانی هەرێم بەرز بنرخێنین کە شەو و رۆژیان کردە یەك بۆ ئەوەی ئەم پرۆسەیە سەرکەوێت. هەروەها پێویستە سوپاسی وەزارەتی پەروەردە بکەین کە ئەو پەڕی هاوکارییان پێشکەش کردین لە رێگای رێگەپێدانی مامۆستایان و دابین کردنی هۆڵەکانی مەشق و راهێنان.

لە کۆتاییدا، سوپاسی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان دەکەین کە بەو پەڕی بەرپرسیارەتییەوە هاوکاریی تیمەکانی سەرژمێرییان کرد بە وەڵام دانەوەی پێویست و پێدانی داتای راست و دروست کە لەئەنجامدا سوودی خودی خۆیان دەبێ لە رێگای پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری و پرۆژە لە لایەن حکومەت و کەرتی تایبەت کە هەر لەسەر بنەمای ئەم داتایانە دابین دەکرێن.

سیروان محمد محی الدین

سەرۆکی دەستەی ئاماری هەرێم

# بەشی یەکەم

# سەرەتا

## 1-1 سەرەتا

دەستەی ئاماری هەرێم لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 2009 سەرژمێرییەکی بۆ گشت بینا و خێزان و دامەزراوە و خاوەندارە کشتوکاڵییەکان ئەنجامدا، کە پێویست بوو هەموو سەرچاوە دارایی و مرۆڤییە گەورەکان لە خۆ بگرێت بۆ ئەوەی چوارچێوەیەکی هەمەلایەنە و نوێ بۆ بیناکان و نشینگەکان و خێزانەکان بە پێی گەرەکەکان و گوندەکان و یەکە کارگێرییەکان دەست بکەوێت. ئەم چوارچێوەیە زۆر پێویستە بۆ دیزاین و راکێشانی نموونەی رووپێوە ئابوورییەکان و رووپێوە خێزانییە جۆراوجۆرەکان. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئەرێنی لەسەر ووردیی پێوانی ئەو دیاردە جۆراوجۆرانە رەنگ بداتەوە کە دیراسە کراون.

هەروەك چۆن بنکەیەکی داتا و زانیاری بۆ گشت بینا و خێزانەکان دەستەبەر ئەکات کە ئەکرێت لە رێگای سیستەمی زانیارییە جوگرافییەکان (GIS) لەسەر نەخشەی تازە و پێشکەوتوو دابندرێن. هەروەها ئەکرێت ئەم زانیارییانە لەگەڵ زانیارییە خزمەتگوزارییەکانی تر پەیوەست بکرێن، وەکو فوتابخانەکان و بنکە تەندرووستییەکان و شەقامەکان و زانکۆکان و بنکەکانی بەرگریی شارستانی و بنکەکانی پۆلیس، کە لە رێگای کۆمپیوتەرەوە زانیاری لەسەر ناونیشانی خێزانەکان و کەسەکان وەربگیرێت ئەویش بە پێی ئەم سیستەمە و بە خێراییەکی زۆر. و بە مەبەستی ئەنجامدانی سەرژمێریی گشتیی دانیشتوان و نشینگەکان لە تشرینی دووەمی 2010، ئامادەکاریی گەورە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی گەمارۆسازی و ژمارەکردنی بیناکان و درووست کردنی چوارچێوەیەکی گشتی دەستیان پێکرد، کە پێویست بوو لەسەر ئاستی بچووکترین یەکەی ئاماری (بلۆك) نەخشەی بۆ درووست بکرێت و تەواو بکرێت، پاشان ژمارە دانان و ژماردنی بیناکان و پێکهاتەکانیان وەکو یەکەکانی نیشتەجێ و نانیشتەجێ، ئینجا گەمارۆدانی گشت دامەزراوە بەرهەمهێنەرەکان و خزمەتگوزارییەکان و خاوەندارێتییە کشتوکاڵییەکان و دانانی چوارچێوەی گشتگیر.

## 2-1 ئامانجەکانی سەرژمێری

بەدەست خستنی داتای نوێی زۆر گشتگیر و وورد لە بارەی گشت کەسەکانەوە لە کاتێکی دیاریکراودا و لەبارەی تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانی بیناکان و نشینگەکان و خێزانەکان، و ئەنجامەکانی سەرژمێری بە بەردی بناغەی پرۆسەی پلان دانان بۆ پێداویستییەکانی داهاتوو و پێویستییە کارگێڕییەکان و هەروەها بۆ هەڵسەنگاندنی دۆخی ژیان و بۆ مەبەستەکانی توێژینەوە و هەروەها بەکارهێنانە بازرگانییەکان و چەندەها بابەتی تریش دادەنرێت.

بۆ دڵنیا بوون لە بەرێوەچوونی پرۆسەکە لەسەر بنەمای تەندرووست و بەهێز، پێویست بە دانانی پلان و بەرنامەیەکی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە بە سوود وەرگرتن لە بنکەی داتا و زانیارییە نوێ و گشتگیرەکان لەبارەی هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە قەبارە و پێکهاتە و تایبەتمەندییەکانی دانیشتوانەوە هەیە، سەرەرای ئەمانەش دامەزراندنی بنکەیەکی گشتگیر و هەمەلایەنەی داتا و زانیاری لەبارەی بینا و نشینگە و دامەزراوە و خاوەندارێتییە کشتوکاڵییەکان کە وەکو چوارچێوەی ئاماری بۆ زۆرێك لە سەرژمێرییەکانی تر و رووپێوە نموونەییەکانی تر بەکاردێت. هەروەها گرنگیی سەرژمێری لە مەزندەکردنەکانی دانیشتوان لە ماوەی نێوان سەرژمێرییەکاندا دەردەکەوێت.

## 3-1 ئامانجەکانی راپۆرت

1- دەستەبەر کردنی زانیاریی ووردەکاری لەبارەی جۆرەکانی بیناکان و دابەشبوونی جوگرافیان بۆ بەکارهێنانیان لە پلانە خزمەتگوزارییەکان ناوچەییەکان و دانانی سیاسەتی و بەرنامەی نیشتەجێ کردن.

2- دەستەبەر کردنی زانیاری و داتا لەبارەی تایبەتمەندییەکانی نشینگەکان و دۆخی نیشتەجێ بوون کە لە دانانیسیاسەت و بەرنامەی نیشتەجێ بوون بەکار دەهێنرێن.

3- دەستەبەر بوونی زانیاریی تایبەت بە گەشەکردنی ناوچە گوندنشینەکان و شارنشینی، بۆ ئەو کەسانەی دانەری سیاسەت و پلان و بەڕێوەبەرن.

4- دانانی بناغەیەك بۆ پلان دانانی بەرنامە و سیاسەتە گشتییەکان بۆ نشینگە مرۆییەکان و بۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی هەبوونی نشینگە و ئاستی پێویستیی نشینگەی نوێ و بۆ ئەنجامدانی لێکۆلینەوە لەبارەی دۆخی بژێوی دانیشتوان لەو نشینگانەی کە نزمترین لە کەمترین ئاستی پێویست.

5- دەستەبەر کردنی زانیاریی ووردەکاری لەبارەی دامەزراوەکان و ئەو تایبەتمەندییانەیان کە پەیوەستن بە چالاکیی ئابووری و جۆری کەرتی کار و ژمارەی کارکەران و دابەش بوونە جوگرافییەکانیان بۆ سوود وەرگرتن لێیان لە بوارەکانی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەلایەتی.

6- دەستەبەر بوونی زانیاری لەبارەی ژمارەی خێزانەکان و نشینگەکان و دابەش بوونی جوگرافیانەیان.

7- دەستەبەر بوونی زانیاریی شیاو بۆ بەراوردکردن لەگەڵ ئەو رووپێو و سەرژمێرییانە تایبەتانەی پەیوەستن بە تێکڕای فەبارەی خێزان و بیناکان و نشینگەکان و دامەزراوەکان و خاوەندارێتییە کشتوکاڵییەکان.

8- دەستەبەر کردنی زانیاریی هەمەلایەنە بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان.

# بەشی دووەم

## 2-1 دابەش بوونە جوگرافی و ئاماری و کارگێڕییەکان

### ⭑) دابەش بوونە جوگرافییەکانی عێراق

بەپێی ڕێبەری جوگرافیای عێراق کە لە گشت سەرژمێرییەکانی پێشووتری عێراق پشتیان پێ بەستراوە بۆ وەرگرتنی هێمای پارێزگا و قەزا و ناحیەکان، پارێزگاکان بۆ سێ بەش دابەش کراون. بەشی یەکەم 5 پارێزگا لە خۆ دەگرێت کە بریتین لە (دهوك، موسڵ (نەینەوا)، سلێمانی، کەرکوك و هەولێر) و هێمای 1 یان پێدراوە و هێمای ئەم پارێزگایانە لە 11 وە دەست پێدەکات تاکو 15 بە ریز. بەشی دووەم 8 پارێزگا لە خۆدەگرێت کە بریتین لە (دیالا، ئەنبار، بەغدا، بابل، کەربەلا، واست، سەلاحەددین، نەجەف) و هێمای 2 یان پێدراوە و هێماکانیان لە 21 وە دەست پێدەکات تاکو 28 بە ریز. بەشی سێیەمیش 5 پارێزگا لە خۆ دەگرێت کە ئەوانیش بریتین لە ( قادسیە، موسەننا، زیقار, میسان، بەسرە) و هێمای 3 یان پێدراوە و هێماکانی ئەم پارێزگایانە لە 31 وە دەست پێدەکات تاکو 35 بە ریز.

هەروەها بۆ هەر قەزایەك لە ناو پارێزگاکەدا هێمایەك دەست نیشان کراوە کە لە دوو پایە پێکدێت و هەروەها بۆ هەر ناحیەیەکیش لە هەر قەزایەك هێمایەك دانراوە کە ئەویش لە یەك پایە پێك دێت و بەم شێوەیە هێمای هەر یەکەیەکی کارگێڕی لە 5 پایە پێکدێت.

بۆ ژینگەش (شارنشین و گوندنشین) هێمایەك دانراوە کە ئەویش لە یەك پایە پێکدێت و هێمایەکیش بۆ گەڕەك یان کەرت لە ناو ناحیە دانراوە کە لە 3 پایە پێکدێت و هەر بەم شێوەیە هێمایەکیش بۆ هەر گوندێك دانراوە لە ناو کەرتەکاندا کە ئەویش لە 3 پایە پێکدێت، بەم پێیەش هێمای بەکار هاتوو بۆ هەر شوێنێك لەسەر ئاستی گەڕەك یان گوند لە 12 پایە پێکدێت.

لەم سەرژمێرییەش هەر پەیڕەوی ئەو دابەشبوونە جوگرافیە کراوە کە بۆ پارێزگا و قەزا و ناحیە و ژینگە (شارنشین و گوندنشین) دکان دانراوە بەلاَم هێمایەکی تایبەت بۆ ئاوەدانییەکان (حی) لە نێو ناوچە شارنشینەکانی ناحیەکان دانراوە کە لە 3 پایە پێکدێت و لە 101 دەست پێدەکات و بە 299 کۆتایی دێت و تیایدا گشت ئەو گەڕەکانەی سەر بە ئاوەدانییەکن دانراون و ئینجا هێمایەکی تایبەت بۆ کەرتەکان لە نێو ناوچە گوندنشینەکانی شارەدێیەکان دانراوە کە لە 3 پایە پێکدێت و لە 301 دەست پێدەکات و بە 999 کۆتایی دێت و تیایدا گشت ئەو گوندانە دیاریکراون کە سەر بە هەر کەرتێکن. پاشان هێمایەکی تایبەت بۆ هەر گەڕەکێك دانراوە لە ناو ئاوەدانییەکەدا کە لە 2 پایە پێکدێت و لە 01 وە دەست پێدەکات و بە 99 کۆتایی دێت و هەروەها هێمایەکیش بۆ گوندەکان دانراوە لە نێو کەرتەکاندا و لە 2 پایە پێکهاتووە و بە 01 دەست پێدەکات و بە 99 کۆتایی دێت. بەم پێیەش هێمای بەکار هاتوو بۆ ناوهێنانی شوێنێك لەسەر ئاستی گەڕەك یان گوند لە 11 پایە پێکدێت.

بۆ مەبەستی سەرژمێریی گشتیی دانیشتوان و نشینگەکان هێمایەك لەسەر ئاستی گەڕەك درووست کراوە کە لە 5 پایە پێکدێت و هێمای دەست نیشانکراو بۆ هەر گەڕەك یان گوندێك هێمایەکی تاقانەیە و دووبارە نابێتەوە لە هیچ شوێنێکی تر لەسەر ئاستی بچووکترین یەکەکانی کارگێڕی (گەڕەك/ گوند). ئەکرێت لە ڕێگای ئەم هێمایەوە هەموو گشت زانیارییەکانی تایبەت بە پارێزگا، قەزا، شارەدێ ژینگە (شارنشین/گوندنشین)، (ئاوەدانی/ کەرت)، (گەڕەك/گوند) بەدەست بێن.

### ⋆) دابەش بوونە ئامارییەکان

بۆ دابەش بوونە ئامارییەکان سیستەمی ناوهێنان و ژمارەکردنی پەیڕەو کراو لە ئاوەدانی و کەرتەکاندا رەچاو کراوە و بە پێی ئەم سیستەمەش ناحیە لە ناوچە شارنشینەکاندا بەسەر چەند ئاوەدانیەکدا دابەش کراوە کە ژمارەیان 4446 ئاوەدانییە، و لە ناوچە گوندنشینەکانیشدا بەسەر کەرتدا دابەش کراوە کە ژمارەیان 9740 کەرتە لە هەموو عێراقدا و هەر ئاوەدانییەکیش بەسەر یەك یا چەند گەڕەکێکدا دابەش کراون کە کۆی گشتی یان 6464 گەڕەکە، ئەمە لە کاتێکدا کە هەر کەرتێك بەسەر چەند گوندێکدا دابەش کراوە کە کۆی گشتیی گوندەکان لە هەموو عێراق 18896 گوندە، دواتر هەر هەموو گوندێك و گەڕەکێك بەسەر چەند بلۆکێك دابەش کراون ئەویش بە پشت بەستن بە ژمارەی بیناکان کە کۆی هەموو بلۆکەکان لە عێراقدا 70051 بلۆکە.

### ⋆) دابەش بوونە کارگێڕییەکان

هەرێمی کوردستان لە رووی کارگێڕییەوە لە 3 پارێزگا پێکهاتووە کە بە سەر چەند یەکەکانی کارگێڕی دابەش کراون بە ناوی قەزا کە ژمارەیان (32) قەزایە لە هەموو هەرێمی کوردستاندا و هەریەك لەم قەزایانەش بەسەر چەند شارەدێ یەکدا دابەش کراون و کۆی شارەدێ یەکان لە هەرێمی کوردستان 128 شارەدێ یە. هەر قەزایەك لە یەك یان چەند شارەدێ یەك پێکدێت و هەر شارەدێ یەکیش بۆ ژینگەی شارنشین و گوندنشین دابەش کراوە. ژینگەی شارنشین بەسەر چەند ئاوەدانییەك و هەر ئاوەدانییەکیش بەسەر چەند گەڕەکێك دابەش کراوە کە بچووکترین یەکەی کارگێڕییە لە شارنشیندا. هەروەها ژینگەی گوندنشین لە ناحیەدا بەسەر چەند کەرتێك و کەرتەکانیش بەسەر چەند گوند دا دابەش کراون، ئەمەش بچووکترین پێکهاتەی پشت پێ بەستراوە لە ناوچە گوندنشینەکاندا. خشتەی خوارەوە ژمارەی قەزا و شارەدێکانی پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان روون دەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە ( 1 ): دابەش بوونی ژمارەی قەزا و شارەدێ یەکان بە پێی پارێزگاکان**

| ناوی پارێزگا | ژمارەی قەزاکان | ژمارەی شارەدێ یەکان |
|---|---|---|
| هەولێر | 9 | 41 |
| سلێمانی | 16 | 61 |
| دهۆك | 7 | 26 |

## 2.2 پێناسە گشتییەکان

### ❖ سەرژمێری

پرۆسەیەکی گشتییە بۆ ژماردنی گشت تاکەکانی زیندوو (عێراقییەکان و بیانییەکان)، ئەوانەی لەناو سنووری جوگرافیایی عێراقدان لە ساتێکی دیاریکراودا، هەروەك کۆکردنەوە و تەیارکردن و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە و بڵاوکردنەوەی گشت زانیارییە دیموگرافی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی پەیوەست بەم کەسانە لەخۆ دەگرێت. هەروەها بۆ زانینی دابەشبوونی جوگرافیانە و تایبەتمەندییە جیاوازەکانیان بە بێ هیچ لابردن یان دووبارە بوونەوەیەك.

### ❖ یەکەکانی کارگێڕی

مەبەست لێ هەرێم و پارێزگا و قەزا و ناحیەکانە بەپێی سنووری کارگێڕییان.

### ❖ ناوەندی یەکەی کارگێڕی

مەبەست لێی ناوەندی قەزا یان ناحیەیە.

### ❖ سنوری شارەوانی

ئەو سنورەیە کە لەلایەن شارەوانیەکانەوە دیاریکراوە بۆ ناوچەیەك بۆ ڕاپەڕاندنی خزمەتگوزاری شارەوانی.

### ❖ شارنشین

ئەو ناوچانەن کە کەوتونەتە سنوری شارەوانیەکان.

### ❖ گوندنشین

ئەو ناوچانەن کە کەوتونەتە دەرەوەی سنوری شارەوانیەکان.

### ❖ گەڕەك

گردبوونەوەیەکی شارنشینانەی دانیشتوانە لە بینا و نشینگە (ئاڤاهی)ی جێگیر یان گەڕۆکدا، هاوسێ یان پەرش و بلاّون و ژمارەیەکی دیاری کراوی هەیە کە لەسەری ڕێکەوتوون یان لە دۆخێکی دان پێدانراوی ناوخۆیی دایە و بەمەش لە شوێنەکانی تر جیادەکرێتەوە. هەروەها سنوری ئاشکرای هەیە، لە یەك یان چەند بلۆکێك پێك هاتووە.

### ❖ کەرت

دابەش بوونێکی کارگێڕییانەی گوندنشینە و لە گوندێك یان زیاتر پێك هاتووە و دانیشتوانی لە نشینگە (ئاڤاهی)ی جێگیر یان گەڕۆکدا دەژین کە دراوسێی یەك یان پەرش و بلاّون و ناو و ژمارەی دیاری کراوی دانپێدانراوی هەیە لە ناوخۆدا، سنوری ئاشکرای خۆی هەیە. ئەگونجێ کەرتێك کەس تیایدا نەژیت.

### ❖ گوند

گردبوونەوەیەکی گوندنشینانەی دانیشتوانە کە تیایدا کەسانێك لە نێو خانوو یان لاریّ (کەپر) یان چادری بەیەکەوە لکاودا دەژین، بەزۆری سەرقاڵی پیشەی کشتوکاڵن بەهەموو جۆرەکانیەوە و ناوی دیاریکراوی هەیە و لەناوخۆدا دانپێدانراوە و سنوری ڕوون و ئاشکرای هەیە کە لە شوێنەکانی تر جیای دەکاتەوە.

### ❖ بلۆك

کۆمەڵێك بینایە کە دەگونجێ گەڕەك/گوند یان بەشێکی بێت و ئەتوانرێ سنوری جیا بکرێتەوە لەسەر زەوی و وێنەی لە سەر نەخشە بکێشرێ و ژمارە هێمای بدرێتێ، سنوری ڕوون و ئاشکرای خۆی هەیە کە دەتوانرێ بە ئاسانی بناسرێتەوە. لە نزیکەی (70- 100) خانووی ئاسایی یان کەمتر لەوە بەپێی جۆری خانووەکان پێك دێت. نمرەی ڕیزبەندی دەدرێتی لەنێو سنوری گەڕەك یان گوند، بەلاّم بلۆك یەکێك نیە لە یەکە کارگێڕییە پشت پێ بەستراوەکان بەڵکو دابەشکردنی گەڕەکە، بەمەبەستی ئاسانکردنی بەڕێوەبردنی پرۆسەی سەرژمێری.

## ❖ شەقام یان کۆڵان

ڕێگەیەکی گشتی یان تایبەتە دەچێت بەرەو دەروازەی بینایەك یان زیاتر، دەگونجێ شەقام یان کۆڵان شۆستە یان قیرتاو کرابێت یان نەکرابێت (خۆڵ بێت) ئەگونجێ ڕێك بێ یان خوار و خێچ، ئەگونجێ لەهەردوولاوە کراوە بێ یان لەلایەکەوە داخراو بێ، دەکرێت بۆ شەقام ناو و ژمارەی جیاواز لەشەقامەکانی تر یان کۆڵانە هاوسێ یان نزیکەکانی هەبێ، ناکرێت ناوی نەبێت، دەتوانرێت ئەو ناوەی کە پێی دەناسرێتەوە سیفەتێکی فەرمیی هەبێت یانیش هیچ سیفەتێکی فەرمیی نەبێت.

## ❖ خانوو

بینایەکی سەربەخۆیە کە لەسەر خۆی وەستاوە و لە ژوورێك یان زیاتر یان پانتایی تر پێك دێت و سەقفێك دای پۆشیوە و زۆر جار دەگونجێ بە دیوارێکی دەرەکی دەور درابێ یان دیوارە جیا کەرەوەکەی لە بناغەوە تا سەقف درێژ بێتەوە. دەگونجێ سەقفی خانووەکە تەنیا لە سەر چەند پایەیەك رابوەستێ. دەکرێت خانووەکە سەقفی نەبێت و لە پانتاییەك پێکهاتبێ کە چوار دەوری دیوار کرابێت. و دەکرێت خانووەکە لە هەر مادەیەکی بیناسازی پێکهاتبێت. دەکرێ لە یەك نهۆم یان زیاتر پێکهاتبێت . بۆ هەر خانوویەك دەرگایەك یان زیاتر هەیە کە لە رێگا یان لە کۆلانەوە ئەگات بە هەموو یان زۆربەی بەشەکانی.

خانوو بۆ مەبەستی نیشتەجێ بوون، بازرگانی، پیشەسازی، یان بۆ پێشکەش کردنی خزمەت گوزاری بەکاردێت. دەکرێ بکرێت بە کارگە یان شوێنی بازرگانی یان شوێنی نیشەجێ بوونی سەربەخۆ یان تەلاری نیشتە جێ بوون یان بازرگانی یان عەمبار یان سەرداب یان کۆگای دانەوێڵە یان هەر شتێکی تر.

ئەگونجێ بینا لە ژمارەیەك خانووی نیشتەجێ بوون پێك هاتبێت وەکو تەلارە نیشتەجێییەکان یان ئەو نشینگانەی لە دوو نهۆم پێك هاتوون و هەریەکیان دەرگای چوونە ژوورەوەی سەربەخۆیان. لەکاتی هەبوونی یەك دەرگای چوونە ژوورەوەی هاوبەش، پاشکۆکانی بینا وەك (گەراج – دوکان – تواليت – کۆگا) بە پێکهاتەی سەرەکیی بینا دادەنرێت نەوەك بینایەکی سەربەخۆ. لە سەرژمێریدا ئەم شوێنانە بە بینا دادەنرێن:

- زەویی پەرژین کراو (سیاج دراو) ئەگەر هەمووی یان بەشێکی بەکار هێنرابێت بۆ نیشتەجێ بوون یان ئیش کردن یان بەکار نەهاتبێت.
- زەویی سەقف نەکراو کە ئیشی تێدا دەکرێ وەك دروست کردنی بلۆك یان کاشی یان بەرد ... هتد.
- ئەو بینایەی لە ژێر دروست کردندایە ئەگەر بناغەی بۆ داندرا بێت و هەر چوار دیواری بۆ کرابێت و بەلای کەم یەك نهۆمی سەقفی بۆ کرابێت.
- بینای پەراوێز خراو چ بە شێوەی هەمیشەیی یان کاتی بێت لە کاتی گەمارۆسازیدا بە بێ ڕەچاو کردنی ئەو ماددەیەی پێی دروست کراوە وەك (چادر، کوخ، چیغ، ... هتد) و لەسەر زەوی یان ئاودا جێگیر کرابێت و بۆ نیشتەجێ بوون یان کارکردن یان هەردووکیان بەکار هێنرابێت.
- ئەو نەفەر هەڵگر و پاپۆرانەی کە لە بەندەرەکان و ئاوە هەرێمایەتییەکانی عێراقدان و بە شێوەیەکی بەردەوام جێگیر کراون و بۆ نیشتەجێ بوون یان بۆ کارکردن بەکار هێنراون.
- عەرەبانە و بۆدی ئۆتۆمبێلەکان کە لە سەر زەوی بەشێوەی بەردەوام یان کاتی لەسەر زەوی جێگیر کراون لە کاتی گەمارۆسازیدا ئەگەر وەك شوێنی نیشتەجێ یان دامەزراوە بەکارهێنرابن.
- هەریەك لە تانکی ئاو و وێستگەی بەهێزکردنی کارەبا و باخچە و گۆرەپانە گشتییەکان و بینای چۆڵکراو کە شیاو نەبێت بۆ نیشتەجێبوون یان بەکارهێنان گەمارۆ نادرێن مەگەر لەناویدا چێشتخانە یان چایخانە یان ماڵێك هەبێت کە ئەوکات بە بینا یان دامەزراوە دادەنرێت. هەروەها چەتر و شوێنەکانی وەستانی پاس و پردەکان بە بینا ئەژمار ناکرێن.

### ❖ دەرگای سەرەکیی چوونە ژوورەوەی بینا

دەرگا یان دەروازەیەك کە بەرەو شەقام یان ڕێڕەو یان ڕێگە یان قادرمە بێت و بچێت بەرەو پێکهاتەکانی بینا و نهۆمەکانی. دەکرێت بینا زیاتر لە یەك دەرگای وەك یەکی هەبێت و ئەوەیان کە زۆرتر بەکار دەهێنرێت وەکو دەرگای سەرەکی دادەنرێت.

### ❖ دەرگای لاوەکیی بینا

هەر دەرگایەك یان دەروازەیەك کە مەرجەکانی باس کراو لە دەرگای سەرەکیی چوونە ژوورەوە نەیانگرێتەوە بە دەرگای لاوەکی دادەنرێت.

### ❖ نمرەی سەرژمێریی بینا لە بلۆکدا

ئەو نمرەیەیە کە تایبەتە بەکارەکانی سەرژمێری و بە بۆیاخ لەسەر بیناکان دادەنرێت بۆ ئاسانکرنی کارەکانی سەرژمێری. ئەم ژمارەلێدانە لەسەر ئاستی بلۆکە، (واتە لە هەر بلۆکێك بەژمارە (یەك) دەست پێ دەکات و بەردەوام دەبێت تا دوایین بینا لە بلۆکەکەدا و بەشێوەی یەك لە دوای یەك).

ئەمە بە پێی پلانی تایبەت بە ژمارەلێدانەوە دەکرێت (جا ئەگەر پلانەکە ژمارەلێدانی شار بێت یان لادێ).

### ❖ نمرەی یەکە لە بینایەکەدا

مەبەست لێی ژمارە لێدانی پێکهاتەکانی بیناکەیە لەشوقە و دامەزراوەکان و ماڵەکان ... هتد. بۆ هەر بەشێك لەم پێکهاتانە ژمارەیەك دادەنرێت بەپێی پلانی تایبەت بە ژمارەلێدان و ئەم ژمارەیە لە هەر بینایەکدا لە (1) وە دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت تا دوایین یەکەی بیناکە و بە شێوەی یەك لە دوای یەك.

## 3.2 پێناسە سەرەکییەکانی تایبە تمەندییەکانی بیناکان و نشینگەکان و خێزانەکان

### ❖ جۆری بینا

- بیناکان پۆلین دەکرێن بۆ:

1- ***باڵەخانە:*** بینایەك کە پێك هاتووە لەدوو نهۆم یان زیاتر بەبێ ڕەچاو کردنی ئەوەی کە نهۆمەکە لە سەر زەوییە یان لە ژێرەوەیە (زیاتر لە یەکەیەکی نیشتەجێ بوون)، قادرمەیەکی هەیە لە ناوخۆ یان لەدەرەوە کە بۆ هەموو نهۆمەکانی بیناکە بەکار دێت و لەوانەیە تەنها بۆ مەبەستی نیشتەجێ بوون بەکاربێت ئەگەر هەموو یەکەکان هی نیشتەجێ بوون بن یان بۆ نیشتەجێ بوون و کار کردن بەکار دەهێنرێت یان تەنها بۆ مەبەستی بازرگانی بەکار دێت.

2- ***خانوو:*** بینایەکی بە تەنهایە کە پێك هاتووە لە یەکەیەکی نیشتەجێبوون و خێزانێك یان زیاتر بەکاری دەهێنن بۆ نیشەجێ بوون یان بۆ کارکردن و نیشتەجێ بوون لەیەك کاتدا و ئەکرێت بە بیناکەی تروە لکابێت (چەسپاو) و لە ژوورێك یان زیاتر پێکهاتبێت.

3- ***کەپر یان زنغ:*** لانەیەك یان بینایەکی سەربەخۆی کاتییە بە ماددەی خاو دروست کراوە کە زۆر و بەردەستە وەك قوڕ، قامیش، گەڵای دار و تەنەکە و تەختەی کانزایی (چینکۆ) یان تەختەی دار و تەنها بۆ نیشتەجێ بوون یان بۆ کار و نیشتەجێ بوون لەیەك کاتدا، بەکار دێت.

4- ***چادر (خێمە) یان ڕەشماڵ:*** لانەیەکە لە پێستی حوشتر یان خوری یان قوماش دروست دەکرێت و دەتوانرێت بە ئاسانی بجوڵێنرێت و بگوازرێتەوە.

5- ***کەرەڤان:*** بینایەکی پێشتر ئامادەکراوە، بەشێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی جێگیر کراوە و ماددەی سەرەکیی دروست کردنی دار، ئاسن یان چینکۆیە و بۆ کار یان نیشتەجێ بوون بەکار دێت.

6- ***دامەزراوە یان كارگە:*** بینایەكە بەكاردێت بۆ كار، داگیر كراوە بە دەزگایەكی حكومی یان ناحكومی و دەكرێت بەشێكی تایبەتی تێدا بێت بۆ بەكارهێنانی پاسەوانەكان. دەكرێت دامەزراوەكە شوێنێكی نیشتەجێ بوونی بەكۆمەڵ بێت كە لە بنەڕەتدا بۆ لەخۆگرتنی كۆمەڵە كەسانێك درووبت كرابێت كە دۆخێكی هاوبەش كۆیان دەكاتەوە وەك نەخۆشخانە، بەندیخانە، شوێنی نیشتەجێ بوونی كرێكاران یان قوتابیان، ... هتد. هۆتێل و مۆتێلەكانیش بە دامەزراوە دادەنرێن.

7- ***مۆڵ یان سەنتەری بازرگانی:*** بینایەكە چەندین رۆڵی دەبینێت و لە بنەڕەتدا وەكو ناوەندێكی تەواو بازرگانی درووست كراوە و بەكاردێت گشت نهۆم و پێكهاتەكانی بۆ چالاكیی ئابووری بەكار دەهێنرێن.

8- ***لە دروست كردندا:*** ئەو بینایە یە كە بناغە و چوار دیوار و بەلای كەم سەقفی نهۆمی یەكەمی بۆی كراوە (نیشانەكانی روون بن) و هێشتا تەواو نەبووبێت و شیاو نەبێت بۆ بەكارهێنان لە كاتی سەرژمێری دا.

## ❖ نشینگە

بینایەكە یان بەشێكە لە بینایەك، شوێنی مانەوەیە و جیا و سەربەخۆیە، لە بنەڕەتدا بۆ نیشتەجێ بوونی خێزانێك یان زیاتر ئامادە كراوە جا بۆ هەر شتێكیش بەكار هێنرابێت لە كاتی سەرژمێریدا. چ لە كاتی گەمارۆسازیدا بەكار هێنرابێت لە لایەن خێزانێكەوە یان زیاتر، یان داخراو بێت، یان چۆڵ بێت و كەسی تیا نەبێت. خێزانێك یان زیاتر تێیدا بن، دامەزراوەیەك یان زیاتر بەكاریان هێنابێت، یاخود لەكاتی گەمارۆسازی یان سەرژمێریدا لە ژێر درووستكردندا بێت. نشینگەكە چوونەژوورەوەیەكی سەربەخۆی هەیە كە بەكاردێت بۆ هاتن و رۆیشتن پێیدا بە بێ ئەوەی ناچار بن بە نشینگەیەكی تردا تێپەڕن. نشینگە لە ژوورێك یان چەند ژوورێكی لكاوی خاوەن یەك دەرگای چوونە ژوورەوە یان چەند ژوورێكی جیا جیا و هەروەها پاشكۆكانی پێكدێت.

بۆ مەبەستی سەرژمێری و بۆ ئەوەی كەس لە پرۆسەی ژماردنی دانیشتوان بێ بەش نەبێت، هەر شوێنێك كە لە كاتی گەمارۆسازی یان سەرژمێریدا كەسێك یان زیاتر بە شێوەیەكی راهاتوو تێدا بن و هیچ شوێنێكی تری نیشتەجێ بوونی راهاتووی تریان نەبێت بە نشینگە دادەنرێت تەنانەت ئەگەر بۆ مەبەستی نیشتەجێ بوونیش درووست نەكرابێت بۆ نموونە وەكو دوكان یان چێشتخانە. بینای بەڵاوە نراو كە بۆ نیشتەجێ بوونی مرۆڤ شیاو نەبێت، بە نشینگە دانانرێت. لەبەر ئەمە نشینگەكان دابەش دەكرێن بەسەر ئەمانەی خوارەوە:

- ***یەكەی نیشتەجێ بوون:***

شوێنێكی مانەوەی جیاكراو و سەربەخۆیە كە بۆ نیشتەجێ بوونی خێزانێك یان زیاتر ئامادە كراوە، یاخود یەكەیەكی ئامادەنەكراوە بۆ نیشتەجێ بوون بەڵام خێزانێك وەكو نشینگەیەك بەكاری دەهێنێت لە كاتی سەرژمێری كردندا و ئەمانەی خوارەوە دەگرێتە خۆی:

أ) ***خانوو و شوقە:*** ئەو شوێنەی كە هەموو یان چەند بەشێكی پێداویستییە بنەڕەتییەكانی نیشتەجێ بوون (وەك چێشت لێنان، شوێنی شووشتن، ئاوی راكێشراو بە بۆڕی و ئاودەست)ی تێدا بێت جیا لەوەی لە كاتی سەرژمێری كردندا چۆڵ بێت یان خێزانێك یان زیاتر لە خێزانێك تێیدا بژین.

ب) ***یەكەكانی نیشتەجێ بوونی كاتی:*** ئەو شوێنانەی بە ماددەی خاوی بەردەستی وەك قامیش، گەڵای دار و (بەردی) یان هەر شتێكی تری هاوشێوە وەكو كۆخ و كەپر درووست كرابن و پێكهاتە سەرەكییەكانی نیشتەجێ بوونیان تێدا نەبێت.

ت) ***یەكەكانی نیشتەجێ بوونی جوڵاو:*** كە وەك شوێنی نیشتەجێ بوون بەكار دێن لە كاتی سەرژمێریدا، وەك چادر، رەشماڵ، كەلەك یان كەشتی، ڤارگۆنەكانی شەمەندەفەر، بەلەم، خانووی سەرئاو، ئەو شتانەی كە رادەكێشرێن وەكو كەرەڤان، ... هتد.

پ) ***یەکەکانی نیشتەجێ بوونی پەراوێز خراو:*** کە دروست نەکراون یان ئامادە نەکراون یان نەگۆڕدراون بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ بەڵام وەکو یەکەی نیشتەجێ بوون بەکار هێنراون لە کاتی سەرژمێریدا، بۆ نموونە یەکەکانی نیشتەجێ بوون لە کۆگاکانی دانەوێڵە، تەوێڵەکان، گەراجەکانی گواستنەوە، ئەشکەوتەکان و شتی تری لەم جۆرانە. هەروەها ئەو یەکەیانەی کە لە بنەڕەتدا بۆ نیشتەجێ بوونی مرۆڤ دروست کراون بەڵام دواتر بەڵاوە نراون و بەهۆی تێکچوونیان گشت خزمەتگوزارییەکانی ناویان راوەستاون، ئەگەر لە کاتی سەرژمێری کردن کەس یان کەسانێك تیا بژین.

ج) ئەو یەکە نیشتەجێ بوونانەی ناو دامەزراوەکان کە کەسانێك تیایاندا دەژین، وەکو نشینگەی پاسەوان یان بەرێوەبەری دامەزراوەکە.

- ***نشینگەی گشتی:***

جۆرێك شوێنی ترە کە لە رووی دروست کردنەوە جیا و سەربەخۆیە و بۆ تێدا بەسەر بردنە و بۆ نیشتەجێ بوونی کۆمەڵانێکی گەورەی تاکەکان دروست کراوە کە دۆخی هاوبەش یان بارێکی تایبەت یاخود ئامانجی هاوبەش پێکەوەیان دەبەستێتەوە. بەگشتی لەم جۆرە شوێنانە شتەکان هاوبەشە وەك شوێنی چێشت لێنان، ژووری دانیشتن، شوێنی نووستن، گەرماو و ئاودەست کە هەموو کەسانی نێو ئەم نشینگەیە بەهاوبەشی بەکاریان دەهێنن و بریتین لە:

أ) ئەو بینایانەی مانەوە تیایاندا بە کرێ دەستەبەر دەبن وەك هۆتێلەکان، مۆتێلەکان، پانسیونەکان و ئەو خانووانەی ژووری راخراو بە کرێ دەدەن.

ب) ئەو شوێنانەی مانەوە تیایاندا بە شێوەی کۆمەڵانی گەورەی خەڵکانێکە کە ئامانجێکی گشتیی هاوبەش یان بەرژەوەندیی هاوبەش پێکەوەیان دەبەستێتەوە وەکو نەخۆشخانەکان، بەشە ناوخۆییەکان، کەنێسەکان، زیندانەکان، خانووەکانی چاودێریی کۆمەڵایەتی، خانووەکانی پەککەوتە و بەساڵاچووەکان، شوێنەکانی مانەوەی رەبەن و راهیبەکان، دێرەکان و کەنێسەکان کە ئەم شوێنانە لە کاتی سەرژمێری کردندا شوێنی مانەوەی راهاتوو بن.

ت) بینای ئامادە کراو بە مەبەستی مانەوەی کاتیی ئەو کەسانەی چالاکی یان بەرژەوەندیی هاوبەشیان هەیە وەکو سەربازگەکان، کەمپی ئاوارەکان، کەمپی کرێکارانی چالاکییەکی تایبەت.

### ❖ هۆتێل یان خانەی پشوودان یان کۆمەڵگەی گەشتیاری

بینای دروست کراوی جێگیرن و بەرامبەر بە کرێی دیاریکراو حەوانەوەیان تیا دەکرێت.

- ***بەشی ناوخۆیی:*** شوێنی مانەوەی جیاکراون و لەسەر خۆی وەستاوە و تایبەت بە نیشتەجێ بوونی کۆمەڵە خەڵکانێکی دیاریکراو کە بەرژەوەندیی هاوبەشیان هەیە دروستکراوە، وەکو قوتابییەکان لە بەشە ناوخۆییەکان یان خانەی مانەوەی پزیشکەکان و هی تر.
- ***خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی:*** بە دەزگایەکی بێ قازانج دادەنرێت کە بۆ چینێکی دیاریکراوی دانیشتوان بەخۆڕایی خزمەتگوزاری پێشکەش دەکات، وەك خانەکان چاودێری کردنی بەساڵاچووان و خانەکانی چاودێری کردنی نەوجەوانان و هی تر.
- ***دەزگا تەندروستییەکان:*** کۆمەڵە بینایەکی دروستکراون کە چاودێریی تەندروستی و چارەسەر پێشکەش بە دانیشتوان دەکەن بە گشتی.
- ***خانەکانی پەرستش:*** مزگەوت، کەنێسە و دێر و شوێنەکانی تری پەرستش کە تایبەتن بە جێ بەجێ کردنی رێنماییە ئایینییەکان.
- ***یەکەکانی چاکسازی و بنکەکانی پۆلیس:*** بریتین لەو بینا حکومیانەی ئەرکێکی فەرمی پێشکەش دەکەن و لە چوارچێوەی دادپەروەری و یاسادا وەك زیندانەکان.
- ***یەکەکانی نیشتەجێ کە کەسانێك تێیدان:*** کۆمەڵە بینایەکن کە بە جێگیری دروستکراون بۆ مانەوەی کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆر ئەوانەی ئامانجی هاوبەش یان بەرژەوەندیی تایبەتی هاوبەش پێکەوە گرێیان دەدات، و پێویستە ژمارە تاکەکان لەم شوێنانەدا 6 کەس یان زیاتر بن.

## ❖ دامەزراوەکان

کۆمەڵە چالاکی و داهاتێکن کە لە لایەن خاوەنێك یان بەڕێوەبەرایەتییەك بەڕێوە دەبردرێت بۆ بەرهەم هێنانی کۆمەڵێکی هاورەگەزی کاڵا و/یان خزمەتگوزاری کە لە یەك شوێنی جوگرافیدا دەکرێت و ئەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوە لە دامەزراوەکاندا هەبێت:

1) ئەنجامدانی چالاکییەکی ئابووری، واتە دامەزراوەکە خزمەتگوزاری و/یان کاڵا پێشکەش بە کەسانی تر بکات.

2) هەبوونی شوێنێکی جێگیر، لەو شوێنەی کە تێیدا هەڵکەوتووە جێگیر بێت و ئەمە بە گشتی بینایەکی سەربەخۆ یان بەشێك لە بینا یان کۆمەڵە بینایەکی لەتەنیشت یەك دەبن و لە یەك شوێنیشدا (لە نێو پەرژینێکدا)، کە دەکرێت کارگەیەك، فوتابخانەیەك یاخود دەزگایەکی حکومی یان بازرگانی بێت. ئەو کەڵ و پەلانەی جوڵاون و کارێك دەکەن بە دامەزراوە دانانرێن تا ئەو کاتەی تایبەتمەندیی جوڵانیان لە دەست بدەن و جێگیر ببن لەسەر زەوی یان لەسەر ئاو (وەکو عارەبانەی جوڵاو یان ئۆتۆمبێل یان فرۆشیاری گەڕۆك). هەروەها شوێنی کارکردنی تایبەت بە دروستکردنی بینا یان ڕێگا یان بەگشتی هەر پرۆژەیەکی تر بە دامەزراوە دانانرێن وەکو خانووی ئامادەکراوی تایبەت بە ئەندازیار و کرێکارەکان. هەروەها گۆڕەکان و بینا شوێنەوارییە کۆنەکان و ئەو بینایانەی بەڵاوە نراون بە دامەزراوە ئەژمار ناکرێن مەگەر لە ناویان چایخانە یان قاوەخانە یان هەر دامەزراوەیەکی تر هەبێت کە خزمەتگوزارییەك پێشکەش بکات و ئەوکات بە دامەزراوە دادەنرێت و گەمارۆ دەدرێت و ژمارەی بۆ دادەنرێت.

3) ئەگەر خاوەنی هەبێت جا چ یەك کەس بێت یان هاوبەشییەك هەبێت لە نێوان چەند کەسانێك یان کەسایەتییەکی (اعتباری).

4) بوونی یەك بەڕێوەبەر (بەڕێوەبردنێکی تاك).

## ❖ ماددەی سەرەکیی دیواری دەرەوەی بینا

ئەو ماددە سەرەکییەیە کە لە دروست کردنی دیواری دەرەوەی بیناکەدا بەکار هاتووە و دەکرێت کەرپوچ، بەرد، بلۆك (پارچەی کۆنکریتی)، پارچەی بینای ئامادەکراو، قوڕ، تەختەی کانزایی (چینکۆ)، تەختەی دار یان شتی تر بێت.

## ❖ساڵی درووست کردنی بینا

مەبەست ئەو ساڵەیە کە بناغەی سەرەکیی بیناکە تیایدا دانراوە.

## ❖ مەبەستی ئێستای بەکار هێنانی بینا

مەبەست چۆنیەتیی بەکار هێنانی بیناکەیە بە چاوپۆشی کردن لە مەبەستی سەرەکیی درووستکردنی بیناکە. دەکرێت بۆ نیشتەجێ بوون و کارکردن لە یەك کاتدا بەکار بێت بۆ نموونە ژوورێکی نشینگە وەکو نۆرینگەی پزیشکی بەکار بێت و ئەویتر وەك یەکەی نیشتەجێ بوون بمینێتەوە. دەکرێت ئەندامانی خێزان تێیدا بن و دەشکرێت بەم شێوازانەی خوارەوە بێت:

1- ***خێزانێك تێیدا بێت:*** یەکەیەکی بیناکەیە کە چەند کەسانێك یان ئەندامانی خێزانێك تیادا دەژین لە کاتی ئەنجامدانی گەمارۆسازی یان سەرژمێریدا.

2- ***نشینگەی داخراو:*** یەکەیەکی بیناکەیە کە کەسانێك تێیدان بەڵام لە کاتی گەمارۆسازی یان سەرژمێریدا ئامادە نین و دەکرێت سەردانی خێزانێکی تریان کردبێت یان ئەرکێك جێ بەجێ بکەن یان خەریکی گەشت و گوزار بن لە ناوەوە یان دەرەوەی وڵات، واتە بۆ ماوەیەکی کورت نائامادە بن.

3- ***نشینگەی چۆڵ (کەسی تیا نییە):*** یەکەیەکی بیناکەیە کە لە کاتی گەمارۆسازی یان سەرژمێریدا کەسی تێدا نییە، یان بۆ بەکرێ دانە (راخراو یان ناڕاخراو بێت) یان دانیشتوانەکەی بۆ دەرەوە وڵات کۆچیان کردبێت و نشینگەکەیان بۆ بەسەر بردنی پشووەکان و مۆڵەتەکان پاراستبێت یان بەودواییانە دروستکردنی تەواو بووبێت یاخود بە هەر هۆکارێکی تر.

4- ***نشینگەی گشتی:*** هەر وەك لە پێناسەی نشینگەی گشتیدا هاتووە.

5- ***هۆتێل:*** بیناکراوێکی جێگیرە کە لە بەرامبەر کرێیەکی دیاریکراودا حەوانەوە دەستەبەر دەکات.

6- ***دامەزراوەی کارکەر:*** دامەزراوەیەکە کە چالاکییەکی ئابووریی دیاریکراو تێیدا ئەنجام دەدرێت و دەکرێت بەرهەم هێنانی کالاّ و/یان پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییەك بێت لە ماوەی گەمارۆسازی و ژمارەکردندا.

7- ***دامەزراوەی داخراو:*** دامەزراوەیەکە کە چالاکییەکی ئابووری تێیدا ئەنجام دەدرێت بەلاّم لە کاتی گەمارۆسازیدا بە شێوەیەکی کاتی راوەستاوە چ بەهۆی سەخبێری کردنی بینای دامەزراوەکە یان کەل و پەلەکانییەوە بێت یاخود بەهۆی وەرزی بوونی چالاکییەکە یان هەر هۆکارێکی تر بێت.

8- ***دامەزراوەی چۆڵ:*** دامەزراوەیەکە کە هیچ چالاکییەکی ئابووری تێیدا ئەنجام نادرێت لەکاتی گەمارۆسازیدا چ بە هۆی ئەوە بێت کە تازە درووستکرابێت و هێشتا دەست بەکار نەبووبێت یان مەبەستی فرۆشتن یان بەکرێدانیان هەبێت.

### ❖ چالاّکی

سروشتی ئەو کارەیە (جۆری کار یان بەرهەمەکەی) کە دامەزراوەکە ئەنجامی دەدات لەناو یەکەی بینادا و ئەکرێت یەکێك لەمانەی خوارەوە بێت:

1- چالاّکیی کشتوکالّی: بەرهەم هێنانی کشتوکالّی لە خۆ دەگرێت بە گشت لقەکانییەوە وەك رووەکی، ئاژەڵی، راو، دارستان، بەرهەمهێناهی ئاژەڵەکان و پەلەوەر و ئەوانی تریش کە لە بیناکەدا ئەنجام دەدرێن وەك چاندنی درەخت و بەرهەم لە شینایيە پەرژین کراوەکان و نەمامگەکان، بەخێو کردنی ئاژەڵی چوارپێی و پەلەوەر و ئاژەڵەکانی تر و ئامادەکردن و پەرەپێدانی تۆ بۆمەبەستی چاندن و زیادبوون. بۆ نموونە چالاّکییەکانی پەیوەندیدار بە کشتوکالّ وەك چاندنی بەرهەمی کشتوکالّی بە هەموو جۆرەکانییەوە، بەخێو کردنی هەموو جۆرە ئاژەڵێك، راو، دارستان، چالاّکییەکانی دوای دروێنە (دوای بەرهەم هاتن)، ئامادە کردن و پەرەپێدانی تۆ بۆ مەبەستی چاندن و زیادبوون (تکاپر)، ... هتد.

2- چالاّکیی پیشەسازی: ئەو چالاّکییەیە کە پەیوەندیی هەیە بە دەرهێنانی سامانی کانزایی و کالاّ فلزییەکان وەك بەکانزا کردن و دەرهێنانی نەفتی خاو، گازی سروشتی، گوگرد، فۆسفات، ... هتد.

بەرهەمهێنانی کالاّی پیشەسازییە گۆڕدراوەکان چالاّکییەکە کە پەیوەندیدارە بە بەرهەمهێنانی کالاّی پیشەسازی لە رێگای گۆڕینی پێداویستییە هاوکارەکان بۆ ئەو بەرهەمە نوێیانەی کە لە مواسەفاتەکانیان جیاوازن لەگەڵ ئەو کالاّیانەی کە هۆکاربوونە بۆ بەرهەمهاتنیان لە رێگای بەکارهێنانی کار و سەرمایە و رێکخستن و ئەوانەش کە لە بینادا ئەنجام دەدرێن وەك ئامادەکردن و پاراستنی گۆشت و بەرهەمەکانی و ماسی و سەوزەوات و مێوەکان، پیشەسازیی زەیت و رۆن، پیشەسازیی بەرهەمەکانی شیر، هاڕینی دانەوێلە، بەرهەمەکانی نانەواخانەکان، کاکائۆ و چۆکۆلێت و هەر پیشەسازییەکی تر، چاپ کردن و ئەو خزمەتگوزارییانەی پەیوەندییان پێوە هەیە، پیشەسازییە کیمیائییەکان، پیشەسازییەکانی دەرمانسازی، پێداویستییەکانی خاوێن کردنەوە، کاتژمێرەکان، ئامێرەکانی تایبەت بە بینین، یارییەکان، گەوهەرەکان، چاککردنەوەی ئامێر و کەرەستەکان، پاککردنەوەی ئاو، درووستکردنی بینا و رێگا، تێکدان، ... هتد. هەروەها بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا و کۆکردنەوە و پاککردنەوە و دابەشکردنی ئاو.

3- چالاکیی بازرگانی: ئەو چالاکییەیە کە پەیوەندی بە کاری بازرگانی هەیە بە هەموو جۆرەکانییەوە (کڕین و فرۆشتنی کاڵاکان) لەگەڵ ئەو چالاکییە بازرگانییانەی پەیوەندیان پێوە هەیە، و هەروەها بازرگانییە پەراوێزیەکانیش دەگرێتە خۆی (قازانجەکانی بازرگانییە بچووکەکان) ئەوانەی لە کاری بازرگانیی بچووکەوە بەدەست دێن

4- چالاکیی خزمەتگوزاری: چالاکییەکە کە پەیوەندی بە دەستەبەر کردنی ئەو خزمەتگوزارییانەوە هەیە کە پێشکەشی تاکەکان و خێزانەکان دەکرێت وەکو خزمەتگوزارییەکانی پزیشکی، پەروەردەیی، ئاسایش و بەرگری، ... هتد.

5- چالاکییەکانی تر: گشت ئەو چالاکییانەن کە لە چالاکییەکانی پێشتردا نین و باسیان نەکراوە، وەك ئەو خزمەتگوزارییانەی پەیوەندییان بە تەندرووستی مرۆڤەوە هەیە، چالاکییە پیشەیی و زانستی و تەکنیکییەکان، چالاکییەکانی بەکرێ دان و بەکرێ گرتن، چالاکییەکانی خزمەتگوزارییەکانی پشتیوانی کردن، چالاکییەکانی ئاسایش و چاودێری کردن، چالاکییەکانی خزمەتگوزارییە تاکەکەسییەکان، چالاکییەکانی بیناکردن و دروست کردن، گواستنەوە و کۆگایی کردن، پەیوەندییەکان، بیمە، ... هتد.

## ❖ کەرتی کار

هەڵکەوتەی دامەزراوەیە لە ڕووی ئەو چالاکییە دەست نیشانکراوەی کە تێیدا دەکرێت و یەك لەمانەی خوارەوەیە:

- ***حکومی:*** ئەگەر خاوەندارێتیی دامەزراوەکە بگەڕێتەوە بۆ حکومەت بە بێ ڕەچاو کردنی ئەوەی ئایا ئەو کارەی تیادا دەکرێت کارگێڕییە یان ڕێکخراوەیی، و پارەدار کردنی بەشێوەی ناوەندییە، وەکو دیوانی وەزارەتەکان.
- ***گشتی:*** ئەگەر خاوەندارێتیی دامەزراوەکە بگەڕێتەوە بۆ حکومەت کارێکی بەرهەمهێنانی تیادا ئەنجام بدرێت و پارەدارکردنی لە لایەن خۆیەوەیە (یان کەسێکەوەیە)، وەك کۆمپانیا بازرگانی و پیشەسازی و گواستنەوەییەکان ... هتد.
- ***تێکەڵاو:*** ئەگەر سەرمایەی دامەزراوەکە بە شێوەی هاوبەش بێت لە نێوان کەرتی تایبەت و کەرتی حکومی بە بێ ڕەچاو کردنی ڕێژەی هەر یەکەیان.
- ***هەرەوەزی:*** ئەو دامەزراوانەن کە خاوەندارێتیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە هەرەوەزییەکان، و سەرمایەکەشی لە پشکی بێ سنور پێك دێت.
- ***تایبەت:*** ئەو دامەزراوەیە کە خاوەندارێتییەکەی بۆ تەنها یەك کەس یان کۆمەڵە کەسانێك لە دەستەی کۆمپانیاکە بگەڕێتەوە بە بێ ڕەچاو کردنی لایەنی یاسایی دامەزراوەکە.
- ***بیانی:*** ئەگەر خاوەندارێتی دامەزراوەکە بە تەواوی بۆ کەرتی تایبەت بگەڕێتەوە و کەسەکەش عێراقی نەبێت یاخود کۆمپانیایەك بێت و لە لایەن کەسانی بیانییەوە بەڕێوە ببردرێت.

## ❖ خێزانی ئاسایی

خێزانی ئاسایی بۆ مەبەستەکانی سەرژمێری پێناسە دەکرێت و بریتییە لە کەسێك یان کۆمەڵە کەسانێك کە پەیوەندیی خێزانیان هەبێت یان نەیانبێت و لە تەواو یان بەشێکی یەکەیەکی نیشتەجێ بووندا بژین و لە خواردن و شتە پێویستەکانی تری ژیاندا هاوبەش بن و خێزانی ئاسایی دابەش دەبێت بۆ:

1) ***خێزانی پێکهاتوو لە تەنها یەك کەس:*** خواردن و کارە پێویستەکانی تری ژیان بە تەنیایی ئەنجام دەدات بێ هەبوونی پەیوەندی بە کەسێکی تر، وەك کۆمەڵە کەسانێك کە لە نشینگەیەکی ئاسایی ( خانوو یان شوقە) یان هۆتێل یان شوێنێکی گەشت و گوزاری دەژین و هیچ پەیوەندییەکی خێزانی پێکەوەیان نابەستێتەوە و هەر یەکێکیان بۆ بژێوی خۆی پشت بە خۆی دەبەستێت.

2) ***خێزانی پێکهاتوو لە چەند کەس:*** کۆمەڵێکی دووکەسی یان زیاتر کە پێکەوە دادەنیشن و سەرۆکی خێزانیان هەیە و لە بەدەست هێنانی خۆراك و پێداویستییەکانی تری ژیاندا هاوبەشن و دەکرێت بوودجەیەکی هاوبەشیان هەبێت و یان نەیانبێت (پێکەوە بەشداری بکەن لە

خەرجییەکاندا لە داهاتی سەرۆکی خێزانەوە یان هەندێ لە ئەندامانی خێزانەوە)، دەکرێت پەیوەندییەکی خێزانی پێکەوەیان ببەستێتەوە یان نەیانبەستێتەوە یانیش هەردوو حاڵەتە تێکەڵاو بن، و ئەندامانی خێزان لە هەموو یان بەشێکی ژەمەکانی خواردن هاوبەش بن.

هەرکەسێك بە شێوەیەکی کاتی لە دەرەوەی وڵات بێت و دوای ماوەی کەمتر لە ساڵێك بگەڕێتەوە و لەگەڵ خێزانەکەدا بژیت بە ئەندامی خێزان دادەنرێت، بێجگە لە قوتابیان و نەخۆشەکان کە بە بێ ڕەچاو کردنی ماوەی مانەوەیان لە دەرەوەی وڵات بە ئەندامی خێزان ئەژمار دەکرێن.

مەرج نییە هەرکەسێك لە خەرجییەکانی خێزاندا بەشدار بێت ئەندامی خێزان بێت، بۆ نموونە ئەو باوکەی بەردەوام لە دەرەوەی وڵات خەریکی کارکردنە و بۆ هاوسەر و منداڵانی خەرجی دەنێرێت بە ئەندامی خێزان دانانرێت مەگەر لەکاتی سەرژمێری کردندا لە گەڵ خێزانەکەیدا بێت.

دەکرێت خێزان بەبێ شوێنی مانەوە بێت و کەڵ و پەڵی خۆی لەگەڵ خۆیدا بگێڕێت و لە سەر شەقام یان بەردەرگای بیناکان یان لەسەر شوستەکان یان لە هەر شوێنێکی تری لەو جۆرە بخەوێت.

## ❖ خێزانی بەکۆمەڵ

کۆمەڵە کەسانێك کە لە نشینگەیەکی گشتیدا دەمیننەوە و هیچ پەیوەندییەکی خێزانی پێکەوەیان نابەستێتەوە و لە ئامادەکارییەکانی ژیاندا بەشداری لەگەڵ یەکتردا ناکەن، بۆ نموونە میوانانی هۆتێل، زیندانەکان، قوتابیان، یەتیمەکان، بەساڵاچووان و پەککەوتووان، و هەروەها ئەو کرێکارانەی پێکەوەن لە نشینگە گشتییەکاندا. ئەو سەربازانەی لە سەربازگەکان یان دامەزراوەکانی تری سوپا دان ئەم پێناسەیە نایانگرێتەوە و لە سەرژمێریدا لە گەڵ خێزانەکانیاندا دەنووسرێن.

پێویستە ڕەچاوی ئەوەش بکرێت کە لە هەندێ نشینگەی بەکۆمەڵ دا خێزانی ئاسایی هەن، بۆ نموونە خێزانی بەڕێوەبەری هۆتێل کە لە شوێنێکی تایبەت لە هۆتێلەکەدا ژیان بەسەر دەبەن یان بەڕێوەبەری نەخۆشخانە و خێزانەکەی، یان بەڕێوەبەری زیندان و خێزانەکەی، بۆیە زانیارییەکانیان لە گەڵ زانیارییەکانی خێزانی ئاساییدا وەردەگیرێن. هەروەها کۆمەڵێکی 6 کەسی یان زیاتر کە لە نشینگەیەکی ئاساییدا دەژین و هیچ پەیوەندییەکی خێزانی پێکەوەیان نابەستێتەوە و هەریەکێکیان لە بژێوی خۆیدا پشت بەخۆی دەبەستێت و لەوانەیە لە هەندێ ژەمی خواردندا لەگەڵ کەسانی تر هاوبەش بن بە خێزانی بەکۆمەڵ دادەنرێن، بۆ نموونە ئەو کرێکارانەی لە شوێنی کارکردندا دەژین یان ئەو کەسانەی پێکەوە لە شوقە یان خانووێکدان. بەڵام ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەی هیچ پەیوەندییەکی خێزانی پێکەوەیان نابەستێتەوە 5 کەس یان کەمتر بێت ئەمانە بە خێزانی بە کۆمەڵ دانانرێن بەڵکو بە خێزانی ئاسایی ئەژمار دەکرێن. هەروەها لە خێزانی بەکۆمەڵدا ئەو کەسانەی نائامادەن بە ئەندامی خێزانەکە دانانرێن.

## ❖ سەرۆکی خێزان

ئەو کەسەیە کە بە شێوەی ڕاهاتوو لەگەڵ خێزانەکەیدا دەژیت و لە ناو وڵاتدایە و بەم ناوە لەناو ئەندامانی تری خێزانەکەدا دەناسرێتەوە بە بێ ڕەچاو کردنی ڕەگەزی ئەو کەسە بەڵام ئەبێت تەمەنی لە 12 ساڵ کەمتر نەبێت. بەگشتی ئەم کەسە خاوەنی دەسەڵاتە و بەرپرسە لە دانانی ڕێکاری تایبەت بۆ کاروباری ئابووریی خێزان و دەکرێت کەسانی تر لەمەدا هاوکاریی بکەن. مەرج نییە ئەو کەسە بێت کە بەتەمەنترین بێت یان دەرامەتی لەوانی تر زیاتر بێت بەڵام مەرجە کە پەیوەندییەکی خزمایەتی هەبێت لەگەڵ هەموو یان بەشێکی ئەندامانی خێزانەکەدا.

## ❖ خاوەندار

کەسێکی ئاسایی یان کەسایەتییەکەی ئیعتبارییە کە لە رووی بەرێوەبردنەوە دەسەڵاتدارە بەسەر کاری خاوەندارێتیە کشتوکاڵییەکەوە، و بە پێی ئەو بابەتانەی کە رێگەی پێدراوە بریار وەردەگرێت و بەرپرسیارەتییە تەکنیکی و ئابوورییەکانی تایبەت بە خاوەندارێتییەکە لەسەر شانیەتی.

ئەکرێت راستەوخۆ یان لە رێگای بریکارێکەوە بەرپرسیارەتییەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت و ئەمانەی خوارەوە بە خاوەندار دادەنرێن:

- ✓ ئەو کەسەی خاوەندارێتییەکی کشتوکاڵی بەرێوە دەبات (خاوەنی بێت یان بەکرێ بێت یان بەرێوەبەری بێت) جا چ تەنها رووەکی بێت یان تەنها ئاژەڵی بێت یان هەردووکیان بێت پێکەوە، لە ناوچەی شوێنی نیشتەجێ بوونی بێت یان لە ناوچەیەکی تر بێت و خۆی بەرێوەی ببات.
- ✓ زەوییەکی بە کرێ گرتبێت و بۆ کاروباری کشتوکاڵی بەکاری بهێنێت.
- ✓ زەوییەک بەکار بێنێت کە هی خۆی نەبێت و بەکرێش نەبێت و مافی سوود لێی وەرگرتنی بە خۆی دابێت و بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بەکاری بهێنێت.
- ✓ ژمارەیەك درەختی لە بن دەست دابن تەنانەت ئەگەر مافی هەڵسوکەوت کردنیشی نەبێت بەرامبەریان.
- ✓ چەند ئاژەڵێکی لە بن دەست دابن بە مەبەستی سوود وەرگرتن لەوان یان لە بەرهەمەکانیان بۆ کاری بازرگانی یان فرۆشتنیان یان فرۆشتنی بەرهەمەکانیان وەکو گۆشت، شیر و (مشتقاته)، پێست و صوف، یان چەند شانەیەکی هەنگوین یان پەڵەوەر یان کێڵگەی پەڵەوەر یان کارگەی هەڵێنەری جوجکەی لە بن دەستدابن.
- ✓ ئەگەر دامەزراوەی حکومی و کۆمپانیا و کۆمەڵەی هەرەوەزییەك هەبێت کە خاوەندارێتییەکی کشتوکاڵی بەرێوە ببات یان کاری پێبکات، ئەوا بە خاوەنداری کشتوکاڵی دادەنرێت. دەکرێت زەوییەکی کشتوکاڵی یان ئاژەڵ یان مێش هەنگ لەژێر دەستی خاوەندارەدا بن یاخود دەکرێت لە یەك کاتدا دوو یان زیاتر خاوەندارێتی کشتوکاڵی بەرێوە ببات لە جۆرەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی. ئەگەر وەکو یەکەیەکی سەربەخۆی کشتوکاڵی بەرێوە ببردرێت و یەك بەرێوەبەرایەتیی هەبێت و هۆکارەکانی بەرهەم هێنان هاوبەش بن، وەکو هێزی کار و ئامێرەکان و ئامرازەکان و ئاژەڵەکان، ئەوا وەکو یەك خاوەندارێتیی کشتوکاڵی ئەژمار دەکرێن.

### ❖ خاوەندارێتی

رووبەرێکە لە زەوییەك کە هەمووی یان بەشێکی بەکار هاتووە بۆ مەبەستەکانی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی و کاروبارە تەکنیکی و کارگێرییەکانی وەکو یەکەیەکی سەربەخۆی کشتوکاڵی لە لایەن تاکە کەسێك یان لەگەڵ چەند کەسانێکی تر بەرێوە دەبردرێن، بە بێ رەچاو کردنی خاوەندارێتی یان کیانی یاسایی یان رووبەر یان هەڵکەوتەکەی. هەروەها ئەو یەکە و دامەزراوانەی ئاژەڵ یان بەرهەمی ئاژەڵی تیایاندا بەرهەم دەهێندرێن بە خاوەندارێتیی کشتوکاڵی دادەنرێن.

### ❖ بەرهەمی رووەکی

برۆشکە کێڵگەییە سەرەکییەکان (وەکو گەنم، جۆ، برنج، گەنمەشامی، پەتاتە، گوڵی گوڵە بەرۆژە، پەمۆ) لە خۆ دەگرێت. هەروەها برۆشکە لاوەکییەکان و سەوزەوات (وەکو باقلە، نیسك، لۆبیا، ماش، وێنجە، تەماتە) و باخەکانی خورما و مێوە و باخی هاوبەش و دارستانەکان و هەموو جۆرە نەمامگەیەك وەکو نەمامگەی درەخت، داری جوانی و دارەکانی دارستانەکان لەخۆ دەگرێت.

### ❖ بەرهەمی ئاژەڵی

بەخێو کردنی ئاژەڵ و بەرهەم هێنانی ئاژەڵ و بەرهەمەکانی ئاژەڵ کە بریتین لە مەر، چێل و گا، بزن، گامێش، حوشتر، کێڵگەکانی پەڵەوەر، کێڵگەکانی ماسی، شانەکانی مێش هەنگ و هی تر، لەخۆ دەگرێت.

# بەشی سێیەم

# ڕێکار

## 1.3 پرسیارنامەی سەرژمێری

ژووری عەمەلیاتی سەرژمێری گرنگیی دا بە بواری بەکار هێنانی تەکنەلۆژیای نوێ و ئامادەکاری بۆ بازدانێکی چوونایەتی لە بواری دانان و جێ بەجێ کردن بە پشت بەستن بە نوێترین ئامۆژگارییە نێودەولەتییەکان لەبارەی سەرژمێریی دانیشتوان و نشینگەکان لە 2010 دا و بنەما و ئامۆژگارییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە جێ بەجێ کردنی سەرژمێرییەکان بۆ گەیشتن بە چوارچێوە ئامارییەکانی هەمەلایەنە و بەووردەکارییەوە لەبارەی بیناکان و تایبەتمەندییەکانیان و خێزانەکان، ئەمانەش لە ڕێگای:

1- بەکارهێنانی سکانەری زیرەك لە داگرتنی پرسیارنامەکانی سەرژمێریدا، بە مەبەستی وەرگرتنی خێرا و ووردی زانیارییەکان و دووری کردن لە هەر جۆرە هەڵە یان لایەنگیرییەك لە داگرتنی داتاکاندا. هەروەك دوای گەڕانەوەی پرسیارنامەکان لە کاری مەیدانییەوە دەست کرا بە رووپێواندنی پرسیارنامەکان و چارەسەرکردنیان لە ڕێگای بەرنامەی تایبەتەوە. بۆ گەیشتن بەمانە پرسیارنامەکانی سەرژمێری بە ڕێگایەکی نوێوە دیزاین کران و بۆ یەکەمجار لە مێژووی سەرژمێرییەکانی عێراق شێوازی تۆماری تایبەت بەکار هات کە لە 25 پەڕی دووڕوو و بە قەبارەی A3 پێکهاتبوو. توێژەری مەیدانی وەڵامە گونجاوەکانی دەنووسی یان لە چوارگۆشە تایبەتەکاندا دایدەنا و بۆ دەستکەوتنی ئەنجامەکان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لە ڕێگای سکانەری زیرەکەوە راکێشران و وەرگیران کە ئەمەش پێویستیی بە ژێرخانێکی لێهاتوو هەبوو. هەروەها پێویستی هەبوو بە ئامادە کردنی کادیری مرۆیی و پێشخستنی لایەنە تەکنیکییەکان بە لێهاتووییەکی بەرزەوە.

2- هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ تەکنەلۆژیای نوێ وەکو سیستەمی زانیاریی جوگرافی (و دابەزاندنی ئەنجامەکانی سەرژمێری لە سەر سیستەمەکە لە داهاتوودا) لە ڕێگای بەکار هێنانی سیستەمەکانی زانیاریی جوگرافی (GIS) لە ئامادەکارییەکانی سەرژمێری و پیشاندانی ئەنجامەکانی سەرژمێریدا.

3- درووستکردن نەخشەی جوگرافیایی و ئامادەکردنیان بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە کارە مەیدانییەکانی سەرژمێریدا کاریان دەکرد ئەویش بە پشت بەستن بە وێنە ئاسمانییە نوێیەکانی ئەو ساڵە کە لە لیژنەکانی سەرژمێرییەوە دەست پێدەکات تا بە بژمێرەکانەوە کۆتایی دێت.

4- دیزاین کردن و دەست نیشانکردنی ناوەڕۆکی پرسیارنامە لە ڕێی بابەت و مواسەفاتەکان بۆ ئەوەی بەرنامە و داتابێسی بۆ دابندرێت.

5- تەیار کردنی ژێرخانەکان و دەست نیشانکردنی بنکەکانی کارکردن لە ناوەند و لە هەرێمدا بە هەموو ئەو ئامێر و کەرەستانەی تایبەت بە پرۆژەکە کە بنکەکان پێویستیان پێبوو.

6- هەڵبژاردنی کادیری لێهاتوو ئەوانەی شارەزاییان هەبوو لە بواری بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ بۆ ئەوەی ئامادە بکرێن وەکو راهێنەر بۆ مەبەستی راهێنانی تیمەکانی کارە تەکنیکییەکان.

7- تواناسازی و ئامادەکردنی کادیری مرۆیی بۆ پێشخستنی لایەنە تەکنیکییەکان بە لێهاتووییەکی بەرز و تایبەت لە بواری تەکنەلۆژیای زانیارییەکانەوە.

8- لێکۆلینەوەیەك سەبارەت بە بابەتەکانی ناوەڕۆکەکە و ئاستی پێویست بوونیان و توانای دەستەبەر کردنیان لە سەرژمێریدا، و گەنگەشەی رەشنووسی پرسیارنامە لە گەڵ کۆمەڵە شارەزایەکی نەتەوە یەکگرتووەکان و پەیمانگەی عەرەبی بۆ راهێنان و لێکۆلینەوەی ئاماری، نوێنەرەکانی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای سکانەری زیرەك بۆ پرسیارنامەکانی سەرژمێری، و ئەو وڵاتانەی لە بواری بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ لە سەرژمێریدا ئەزمونیان هەیە وەکو مەغریب، مسر، سودان، ئوردن و نۆرویژ، لە رووی شێوە و ناوەڕۆك و ئاستی وەڵامدانەوە بۆ دەستەبەر کردنی زانیاریی پێویست و گونجاندنی لەگەڵ ئەو شتانەی بڕیاریان لەسەر دراوە و مواسەفاتی سکانەری زیرەك لە ڕێگای ناسینی ئەو کێشە و ئاستەنگانەی لە ئەزمونەکانیان بەدەرکەوتن.

